پوختەی :

# كِتَابُ المِحْنَةِ

مختار

مِحْنَةُ أَبِي عَبْدِ اللهِ أَحْمَدَ بْنِ مُحَمَّدِ بْنِ حَنْبَلٍ الشَّيْبَانِيِّ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ

رِوَايَةُ وَلَدِهِ أَبِي الفَضْلِ صَالِحٍ (ت ٢٦٥هـ)

بِرِوَايَةِ أَبِي بَكْرٍ الإِسْفَرَايِينِيِّ عَنْهُ



وَيَلِيهِ مِنْ عَمَلِ المُحَقِّقِ

المُسْتَدْرَكُ مِنْ كِتَابِ المِحْنَةِ رِوَايَةِ أَبِي الفَضْلِ صَالِحٍ

المَجْمُوعُ مِنْ مَرْوِيَّاتِ أَبِي الفَضْلِ صَالِحٍ فِي المِحْنَةِ وَغَيْرِهَا

• عبدالملك الأثرى •

١٤٤٥ هـ

١ - أبو الفَضل - صالح بن أحمد بن محمد بن حنبل - وتی :

( ' گوێم لە باوکم بوو وتی : لە ساڵی ١٦٤ لەدایک بووم ' .

وە باوکی محمد بن حنبل لە تەمەنی ٣٠ ساڵیدا وەفاتی کردووە، هەربۆیە دایکی بەخێوی کردووە) .

٢ - أبو الفَضل وتی :

(باوکم رحمه الله ڕۆژی جومعە، ساڵی ٢٤١ وەفاتی کرد، تەمەنی ٧٧ ساڵ بوو ڕەحمەتی الله ی لێبێت) .

٣ - أبو الفَضل وتی :

(باوکم وتی : ' لە تەمەنی ١٦ ساڵیدا دەستم کرد بە فێربوونی فەرموودە .

کاتێک هُشَیم وەفاتی کرد من ٢٠ ساڵ بووم، ئەوەی لێم بیستبوو لەبەرم بوو، پیاوێک هات بۆ لای ماڵی إبن عُلَیَّة و کتێبەکانی هُشَیم ی پێبوو، فەرموودەکانی ناوی بەسەر مندا خوێندەوە، منیش پێموت : ئەوەیان سەنەدەکەی ئاوا و ئاوایە .

ئەو ساڵەی هُشَیم وەفاتی تێدا کرد کە ١٨٣ بوو، من دەرچووم بۆ کوفە، ئەوەش یەکەم ساڵی گەشتەکەم بوو .

وە یەکەم دەرچوونیشم بۆ بەسرە ساڵی ١٨٦ بوو ' ) .

٤ - أبو الفَضل وتی :

(پرسیارم لێ كرد : له كام ساڵدا گه‌شتت كرد بۆلای سفیان بن عیینة؟

وتی : ' ساڵی ١٨٧، كاتێک گه‌یشتینه ئه‌وێ تازه فضیل بن عیاض وه‌فاتی كردبوو، ئه‌و ساڵه یه‌كه‌م حه‌جم تێدا كرد، وه ساڵی ١٩٩ لای عبدالرزاق مامه‌وه، وه ساڵی ١٩٨ هه‌واڵی مردنی سفیان بن عیینة و یحیي بن سعید و عبدالرحمن بن مهدي مان پێگه‌یشت.

ئه‌گه‌ر ٥٠ درهه‌مم پێبووایه گه‌شتم ئه‌كرد بۆلای جریر بن عبدالحمید بۆ الري، هه‌ندێک له هاوڕێكانم ڕۆیشتن بۆلای، به‌ڵام نه‌متوانی بڕۆم، چونكه پاره‌م پێ نه‌بوو.

پێنج حه‌جم كردوون، سێ دانه‌یان به پێ ڕۆیشتووم، له هه‌ر دانه‌یه‌كیاندا ٣٠ درهه‌مم خه‌رج كردووه .

یه‌كه‌م گوێلێبوونم له هُشَیم ئه‌وه ساڵی ١٧٩ بوو، وه إبن المبارک هات بۆلامان له‌و ساڵه‌دا، ئه‌وه كۆتا هاتنی بوو، ڕۆیشتم بۆ دانیشتنه‌كه‌ی، به‌ڵام وتیان : ده‌رچووه بۆ طرسوس - ئه‌وكاته جیهادی لێكراوه - ، وه ساڵی ١٨١ وه‌فاتی كرد ' ).

٥ - أبو الفَضل وتی :

(بە باوكم وت : لە فەرموودەدا ئەمەی تێدایە ' رسول الله ﷺ فەرمووی ' ، كەسێک ئەیكات بە ' پێغەمبەر علیه السلام ئەفەرمووێت ' ؟

وتی : ' هیوام وایە كێشەی نەبێت ').

٦ - أبو الفَضل وتی :

(كاتێک باوكم بیویستایە دەستنوێژ بگرێت نەیئەهێشت هیچ كەس ئاو بكات بە دەستەكانیدا تا دەستنوێژ بگرێت، بەڵكو خۆی ئاوی ئەكرد بە دەستی خۆیدا).

٧ - أبو الفَضل ئەڵێت :

(گوێم لێبوو زۆر سورەتی الكهف ی ئەخوێند).

٨ - أبو الفَضل ئەڵێت :

(جاری وا هەبوو نەخۆش ئەكەوتم، جامۆڵكەیەک ئاوی ئەهێنا، قورئانی بەسەردا ئەخوێند، پاشان ئەیوت : ' لێی، بخۆرەوە، وە دەموچاو و دەستەكانت بشۆ ').

٩ - أبو الفَضل ئەڵێت :

(جاری وا هەبوو ئەڕۆیشت بۆ بازاڕ، دەستە دار و شتی دیکەی ئەکڕی، پاشان خۆی هەڵیئەگرت).

١٠ - أبو الفَضل ئەڵێت :

(ڕۆژێکیان هات بۆلامان، وە لەلای من پیاوێکی نابینای لێبوو قورئانی ئەخوێند، هەواڵم پێدرا کە یەکسەر دانیشت و گوێی گرت - واتە ئیمام أحمد - ).

١١ - أبو الفَضل ئەڵێت :

(ڕۆژی جومعە بینیم، ئیمام وتاری ئەدا، وە داواکارێک داوای ئەکرد، وە لەپاڵ باوکمدا پیاوێک هەبوو، داواکارەکە ڕووی لە باوکم کردبوو، جا پیاوەکە خۆی چەماندەوە و لە دەستیدا پارەی تێدا بوو بۆ ئەوەی باوکم وەریبگرێت و بیدات بە داواکارەکە، باوکم پارەکەی وەرنەگرت لە پیاوەکە).

١٢ - أبو الفَضل ئەڵێت :

(ڕۆژی جومعە لەگەڵی ڕۆشتم بۆ مزگەوتی الجامع و خەڵکی هاتنە دەرەوە - واتە فریای نوێژی جومعە نەکەوتوون - ، پاش ئەوە باوکم چوویە مزگەوتەوە، وە إبراهيم بن هانئ النيسابوري مان لەگەڵدا بوو، باوکم ڕۆشتە پێشەوە و چوار ڕکعات نوێژی نیوەڕۆی بۆ کردین .

- باوکم - وتی : ' إبن مسعود هەمان شتی کرد لەگەڵ علقمة و الأسود ' ) .

**١٣** - أبو الفَضل ئەڵێت :

(باوكم بۆی گێڕامەوە وتی : عبدالرحمن بن مهدي بۆی گێڕاینەوە وتی لە سفیان، لە الحسن بن عبیدالله وتی : ' من و زر نوێژی جومعەمام لەدەست چوو، هەربۆیە بە جەماعەت نوێژمان كرد، جا ئەمەم گێڕایەوە بۆ إبراهیم - **النخعي** - وتی : ' عبدالله بن مسعود هەمان كاری كرد لەگەڵ علقمة و الأسود لە ڕۆژی جومعەدا ' .

**١٤** - أبو بكر الإسفرایني ئەڵێت :

(پرسیارم لە إبراهیم - **إبن هانئ** - كرد دەربارەی ئەمە، وتم : جومعەتان لەدەست چوو لەگەڵ أحمد، پاشان چوار ڕكعات نوێژی بۆ كردن؟

وتی : ' بەڵێ ' ) .

**١٥** - أبو الفَضل ئەڵێت :

(باوكم بۆی گێڕامەوە وتی : عبدالرزاق بۆی گێڕاینەوە وتی : سفیان هەواڵی پێداین وتی : لە الحسن بن عبیدالله ـەوە وتی : ' من و زر پێكەوە نوێژمان كرد، وە جومعەكەمان فەوتا، جا پرسیارم كرد لە إبراهیم - **النخعي** - وتی : ' عبدالله بن مسعود هەمان كاری كرد لەگەڵ علقمة و الأسود ' .

سفیان وتی : ' من و الأعمش یش كردمان ' .

باوكم وتی : ' إیاس بن معاویة ی قازی بەسرە ش كردوویەتی ' ) .

**١٦** - أبو الفَضل ئەڵێت :

(باوكم بۆی گێڕامەوە وتی : زيد بن حباب بۆی گێڕاینەوە وتی : جميل بن حبيب بۆی گێڕامەوە وتی : ' ڕۆژی جومعە هاتم بۆ مزگەوت، بينيم خەڵكی نوێژیان كردووە، وە إياس هات، ئەوكات قازی بەسرە بوو، لە سووچێكی مزگەوتەكەدا پێشكەوت و نوێژمان كرد نە جەماعەت ' ) .

باوكم وتی : (وە سويد بن غفلة نوێژی جومعەی لەدەست چوو، پاشان نوێژی نیوەڕۆی بە جەماعەت كرد).

**١٧** - صالح وتی :

(لەگەڵ باوكم ئامادە بوون لەلای إبراهيم بن أبي الليث ی هاوەڵی الأشجعي، وە علي بن المديني و عباس العنبري و كۆمەڵەیەكی زۆر لە ئەهلی حەدیث ئامادەبوون، بانگی نوێكی نیوەڕۆ درا، گوێیان لە بانگەكە بوو، علي پێی وت : ' أبا عبدالله ئەڕۆیت بۆ مزگەوت یان لێرە نوێژ ئەكەیت؟ '

وتی : ' ئێمە خۆمان جەماعەتین، لێرە نوێژ ئەكەین ' ، پاش ئەوە نوێژیان كرد) .

**١٨** - أبو الفَضل ئەڵێت :

(باوكم بينی كاتێك مامەی مرد كە ناوی (عبدالله بن حنبل) بوو، كاتێك بۆنی لێدرا و كفن كرا ناوچاوانی ماچ كرد پێش ئەوەی دەموچاوی دابپۆشرێت).

**١٩** - أبو الفَضل ئەڵێت :

(وە کاتێک لەسەر جەنازە ئامادە بووایە ئەوە لەپێشیەوە ڕێی ئەکرد، یان لە نزیکەوە، وە ئەیوت : ' ئەگەر پێشی بکەوێت بەلامەوە باشترە ' ).

**٢٠** - أبو الفَضل ئەڵێت :

(باوکم بۆی گێڕامەوە وتی : عبدالرزاق بۆی گێڕاینەوە وتی : معمر بۆی گێڕاینەوە لە الزهري کە ' رسول الله ﷺ و أبو بکر و عمر لەپێش جەنازەوە ڕێیان ئەکرد ' .

الزهري وتی : ' القاسم بۆی گێڕامەوە کە باوکی لەپێش جەنازەوە ئەڕۆیشت ' ).

**٢١** - أبو الفَضل ئەڵێت :

(باوکم بۆی گێڕامەوە وتی : حجاج بۆی گێڕاینەوە وتی : لیث بۆی گێڕاینەوە وتی : عقیل بن خالد بۆی گێڕاینەوە لە إبن شهاب ـەوە لە سالم بن عبدالله هەواڵی پێداوە کە ' عبدالله بن عمر لە پێش جەنازەوە ڕێی ئەکرد، وە رسول الله ﷺ لەپێش جەنازەوە ڕێی ئەکرد، وە أبو بکر و عمر و عثمان یش رضي الله عنهم ' ).

**٢٢** - أبو الفَضل ئەڵێت :

(باوكم بۆی گێڕامەوە وتی : باوكم بۆی گێڕامەوە وتی : سفيان بۆی گێڕاينەوە وتی : محمد بن المنكدر گوێی لە ربيعة بن عبدالله بن هدير بووە كە وتوويەتی : ' بينيم عمر خەڵكی ئەخستە پێش جەنازەكەی زينب بنت جحش ـەوە ' ).

**٢٣** - أبو الفَضل ئەڵێت :

(باوكم وتی : ' نابێت دابنيشيت هەتا جەنازەكە لەسەر ملی هەڵگرانی نەهێنرێتە خوارەوە).

**٢٤** - أبو الفَضل ئەڵێت :

(چوار جار تەكبيرەی ئەكرد لەسەر جەنازە، وە لەگەڵ هەر تەكبيرەكەيدا دەستەكانی بەرز ئەكردنەوە، لە يەكەم تەكبيرەدا فاتيحەی ئەخوێند، وە يەك جار سەلامی ئەدايەوە).

**٢٥** - أبو الفَضل ئەڵێت :

(كاتێك ئەڕۆيشتە گۆڕستانەوە، نەعلەكانی دائەكەند و ئەيگرت بە دەستيەوە).

**٢٦** - أبو الفَضل ئەڵێت :

(ئەگەر منداڵێكم بوايە ئەو ناوی ئەنا) .

**٢٧** - أبو الفَضل ئەڵێت :

(وە ئەگەر ببومایە بە خاوەنی منداڵێکی کچ، ئەیوت : ' پێغەمبەران باوکی کچان بوون ' ، وە ئەیوت : ' لەبارەی کچانەوە ئەوە هاتووە کە خۆت ئەزانیت - **مەبەستی ئەو فەرموودەیانەیە لە فەزڵی بەخێوکردنی کچدا هاتوون** - ' ).

**٢٨** - أبو الفَضل ئەڵێت :

(ڕۆژێکیان لە ماڵەکەم نانی خوارد، پاروویەکی ئامادە کرد و دای بە خزمەتکارەکە).

**٢٩** - أبو الفَضل ئەڵێت :

(بووم بە خاوەنی منداڵێک، هاوڕێیەکم شتێکی بە دیاری بۆ هێنام، مانگێک پاش ئەوە هات و ئەیویست بڕوات بۆ بەسرە، پێمی وت : ' ئەتوانیت قسە لەگەڵ أبا عبدالله - **واتە ئیمام أحمد** - بکەیت تا نامەیەکم بۆ بنووسێت بۆ ئەو شێخانەی بەسرە؟'

جا قسەم لەگەڵ کرد

وتی - **واتە ئیمام أحمد** - : ' بۆی نانوسم، ئەگەر دیاری پێ نەدایتایە ئەوە بۆم ئەنووسی ' ) .

**٣٠** - أبو الفَضل ئەڵێت :

(هەرگیز نەمبینیوە هەنار و بەهێ بكڕێت، وە هیچ شتێكی تر لە میوە، تەنها ئەوە نەبێت شووتی ئەكڕی و بە نانەوە ئەیخوارد، یان ترێ و خورما، بێجگە ئەوانە نەمبینیوە بیكڕێت).

**٣١** - أبو الفَضل ئەڵێت :

(باوكم پێی وتم : ' لە كاتی گرانیدا دایكت پەتێكی باریكی ئەچنی، پاشان ئەیفرۆشت بە دوو درهەم، زیاتر یان كەمتر، ئەوكاتە ئەوە بژێویمان بوو ').

**٣٢** - أبو الفَضل ئەڵێت :

(كاتی خۆی پێش ئەوەی پارە لە سوڵتان وەربگرین نانی لە ماڵمان ئەخوارد، وە جار جار شتمان بۆ بناردایە وەری ئەگرت و لێی ئەخوارد).

---

: مەبەست لە (پێش ئەوەی پارە لە سوڵتان وەربگرین) ئەوەیە كاتێک ئیمام أحمد سەبری گرت و میحنەكەی لەسەر لاچوو، المتوكل مەعاشی بڕیەوە بۆ ماڵی ئیمام أحمد و منداڵەكانی و مامی، ئەوانەی تر پارەكەیان قبووڵ كرد بێجگە لە ئیمام أحمد، مەعاشەكە بەردەوام بوو هەتا ساڵی ٢٤٧ هـ ئەوكاتەی المتوكل لەلایەن كوڕەكەیەوە كوژرا .

**٣٣** - أبو الفَضل ئەڵێت :

(شەوێكيان نەخۆش كەوتم بەهۆی ئازاری چاومەوە، بەردەوام لەگەڵمدا بوو، وتم : ' ئەی پەروەردگارم داوای سەبرت لێ ئەكەم. '

وتی : ' داوای سەلامەتی - **العافية** - لە الله بكە، چونكە سەبر لەگەڵ بەڵا و ناخۆشيدا دێت ' ) .

**٣٤** - أبو الفَضل ئەڵێت :

(نامەی نووسی بۆ إسحاق بن راهويه، پاشان إسحاق نامەی بۆم نووسی : ' ئەمير عبدالله بن طاهر بانگی كردم، منيش ڕۆشتم بۆ لای و نامەكەی أبي عبدالله م پێبوو.

وتی : ئەو نامەيە چييە؟

وتم : نامەی أحمد بن حنبل.

وتی : ' بمدەرێ ' .

بردی و خوێنديەوە، وە وتی : ' من ئەو و حمزة بن هيصم البوشنجي م خۆشئەوێت، لەبەر ئەوەی تێكەڵی دەسەڵاتدار نابن، وە من ئەم نامەيەت نادەمەوە '.

نامەكەی برد و لە ژێر بەرماڵەكەيدا داينا ' .

نامەکەی إسحاق م بەسەر باوکمدا خوێندەوە، ئیتر نامەی بۆ نەنووسیەوە) .

**٣٥** - أبو الفَضل ئەڵێت :

(ویستم بەندەیەکی نەسرانی بکڕم، وتی : ' ئافرەتی نەسرانی مەکڕە ' ) .

**٣٦** - أبو الفَضل ئەڵێت :

(لە سەردەمی الواثق دا ڕۆژێکیان ڕۆیشتمە لای باوکم، وە الله ئەزانێت لە چ بارودۆخێکدا بووین - **واتە حاڵمان خراپ بوو لە ڕووی داراییەوە** - وە ڕۆشتبوو بۆ نوێژی عەسر، ڕاخەرێکی هەبوو لەسەری دائەنیشت، هێندە کۆن بوو بوو لەیەک هەڵوەشابوو، لەژێریدا کاغەزێک هەبوو، تیایدا نووسرابوو ' ئەی باوکی عبدالله پێم گەیشتووە کە تۆ لە چ ناڕەحەتیەکیدایت، وە چەندە قەرزت لەسەرە، هەربۆیە بە فڵان کەسدا چوار هەزار درهەمم بۆ ناردوویت تا قەرزەکانتی پێ بدەیتەوە و گوزەرانی ماڵ و منداڵتی پێ خۆش بکەیت، وە ئەمە پارەی خێر و زەکات نییە، بەڵکو لە باوکمەوە بە میراتی بۆم ماوەتەوە '، نامەکەم خوێندەوە و دامنایەوە.

کاتێک هاتە ژوورەوە - **واتە ئیمام أحمد** - وتم : باوکە گیان ئەو نامەیە چییە؟ دەموچاوی سوور بوویەوە و وتی : ' من لە تۆ شاردمەوە '

وتی : ' تۆ وەڵامی نامەکە ئەبەیتەوە ' .

پاشان بۆ پیاوەکەی نووسی : ' نامەکەت گەیشت پێم، وە ئێمە لە خۆشی و سەلامەتیداین، قەرزەکەمان هی کەسێکە کە پەلەمان لێ ناکات، وە ماڵ و منداڵیشمان لە نیعمەت و خۆشیدان والحمدلله ' .

پاشان نامەکەم بردەوە بۆ ئەو کەسەی کە نامەی پیاوەکەی بۆ هێنابووین، وتی : ' ماڵت ئاوا ! ئەگەر أبو عبدالله ئەم پارەیەی وەرگرتایە و بۆ نمونە فڕێی بدایەتە دیجلەوە پاداشتی وەرئەگرت، چونکە ئەم پیاوە بە ئەنجامدانی کاری خێر ناسراو نییە ' .

پاش ماوەیەک هەمان نامە لە هەمان پیاوەوە هاتەوە، ئەویش بە هەمان شێوەی پێشوو وەڵامی دایەوە.

پاش زیاتر یان کەمتر لە ساڵێک باسی ئەو پارەیەمان کرد، وتی : ' ئەگەر وەریشمان بگرتایە تا ئێستا تەواو بووبوو ' ) .

**٣٧** - أبو الفَضل ئەڵێت :

(ئامادە بووم دوای مەغریب إبن الجروي ی برای حسن هات بۆلای و وتی : ' من کەسێکی بەناوبانگم، لەم کاتەدا هاتووم بۆ لات و شتێکم هەیە بۆم ئامادە کردوویت، حەز ئەکەم لێم وەربگریت، وە میراتیە ' بەردەوام ئەم قسەیانەی ئەکرد هەتا هێندە زۆری وت هەستا و هاتە ژوورەوە.

پاشان حسن پێی وتم : براکەم وتی ' کاتێک کە دیتم هەتا زۆرم لێ بکردایە ئەو زیاتر ئەرۆشتە دواوە، وتم پێی ئەڵێم - پارەکە - چەندە، وتم : ئەی باوکی عبداللە سێ هەزار دینارە '، جا هەتا و بەجێمهێشتم).

**٣٨** - أبو الفَضل ئەڵێت :

(أبو محمد فوران پێی وت : ' گوێرەویم هەیە بۆت بنێرم؟

بێدەنگ بوو.

دوای ئەوەی أبو محمد لێی دووبارە کردەوە وتی : ' ئەی أبو محمد گوێرەویەکەم بۆ مەنێرە دڵم پێیەوە سەرقاڵ بووە ' ) .

**٣٩** - أبو الفَضل ئەڵێت :

(پیاوێک لە چین ەوە کاغەزی چینی ناردبوو بۆ کۆمەڵێک لە فەرموودەوانان، یحیی و بێجگە ئەویشی تێدابوو، وە شتێکی نارد بۆ باوکم تا کاغەزەکانی تێدا دابنێت، بەڵام ڕەتی کردەوە).

**٤٠** - أبو الفَضل ئەڵێت : (وتم بە باوکم : پێم گەیشتووە کە أحمد بن الدورقي هەزار دیناری پێ دراوە.

وتی : ' بەڵێ کوڕی خۆم، ڕزق و ڕۆزی پەروەردگارت باشترە و هەمیشە ئەمێنێتەوە - مەبەستی بەهەشتە - ' ) .

**٤١** - أبو الفَضل ئەڵێت :

(ڕۆژێکیان لەپاڵیدا باسی پیاوێک کرا، وتی : ' ئەی کوڕی خۆم، براوە ئەوەیە کە بەیانی - **و اتە لە قیامەت** - ئەیباتەوە، وە ئازاری کەسی نەدابێت).

**٤٢** - أبو الفَضل ئەڵێت :

(گوێم لە باوکم بوو زۆر ئەیوت : ' اللَّهُمَّ سَلِّم سَلِّم : ئەی پەروەردگارم سەلامەتم بکە، سەلامەتم بکە ' ).

**٤٣** - أبو الفَضل ئەڵێت :

(باوکم بۆی گێڕامەوە وتی : یونس بن محمد بۆی گێڕاینەوە وتی : حماد بن زید بۆی گێڕاینەوە وتی : یحيى بن سعيد وتی کە سعيد بن المسيب ئەیوت : ' اللَّهُمَّ سَلِّم سَلِّم : ئەی پەروەردگارم سەلامەتم بکە، سەلامەتم بکە ' ).

**٤٤** - أبو الفَضل ئەڵێت :

(ئەگەر کەسێک دووعای بۆ باوکم بکردایە، باوکم ئەیوت : ' ئیماندار هیچی بۆ نامێنێتەوە تەنها قەبرەکەی نەبێت، کار و کردەوە بەگوێرەی کۆتاییەکەیەتی).

**٤٥** - أبو الفَضل ئەڵێت :

(ڕۆژێکیان هاتمەوە بۆ ماڵەوە پێم وترا : باوکت دوێنێ ناردبووی بە دواتدا.

وتم : ناردبووت به دوامدا؟

وتی : ' دوێنێ کەسێک هات بۆلام حەزم ئەکرد ببینیت، کاتێک دانیشتبووم لە قرچەی نیوەڕۆدا پیاوێک لە دەرگای دا، وەک بڵێیت دڵم بۆی ئاسوودە و ئارام بوو، هەستام و دەرگاکەم کردەوە، پیاوێکم بینی کە جلێکی خوری لەبەردا بوو، پارچە سەرپۆشێکی دابوو بەسەریدا، وە لەژێر خوریەکەوە قەمیسێکی لەبەردا بوو، نە شتێکی پێبوو ئاو و خۆراکی تێدا هەڵبگرێت، نە گۆچان، وە گەرمی خۆر ڕەنگی دەموچاوی گۆڕیبوو.

وتم : ' وەرە ژوورەوە '، جا هاتە هۆڵەکەوە.

وتم : ' لە کوێوە هاتوویت؟ '

وتی : لەلای ڕۆژهەڵاتەوە، ئەڕۆم بۆ یەکێک لەو کەنار دەریایانە، ئەگەر لەبەر ماڵی تۆ نەبوویایە نەئەهاتمە ناو ئەم شارەوە، بەڵام نیەتم هێنابوو سەلامێکت لێ بکەم.

وتم : ' بەم حاڵەوە؟! '

وتی : بەڵێ .

پاشان پێی وتم : زوهد لە دنیادا چییە؟

وتم : ' کەمی هیوا و ئاوات ' .

أبو الفَضل وتى : (باوكم وتى : ' سەرم لێى سووڕمابوو، لە ناخى خۆمدا وتم : خۆ من نە زێڕم هەيە نە زيو! چوومە ماڵەوە و چوار پارچە نانم هێنا بۆى، وتم : من نە زێڕم هەيە نە زيو، وە ئەمەش خۆراكمە. '

وتى : ئەى أبا عبدالله پێت خۆش ئەبێت ئەمەت لێ وەرگرم؟

وتم : ' بەڵێ، جا لێى وەرگرتم و خستنيە ژێر كۆشيى و وتى : هيوادارم هەتا الرقة بەشم بكات، بە اللە ت ئەسپێرم، هەر بە پێوە بووم تەماشام ئەكرد هەتا لە كۆڵانەكە دەرچوو. '

أبو الفَضل ئەڵێت : باوكم زۆر باسى ئەكرد).

**٤٦** - أبو الفَضل ئەڵێت :

(گوێم لە باوكم بوو وتى : كاتێك براينە لاى إسحاق بن إبراهيم بۆ تاقيكردنەوە، ئەو نامەيەى بەسەردا خوێندرايەوە كە لە طرسوس ـەوە هاتبوو، لەوەى كە بەسەرماندا خوێندرايەوە بريتيبوو لە ' هيچ شتێك وەكو ئەو نييە، وە دروستكەرى هەموو شتێكە ' .

منيش وتم : | **وَهُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْبَصِيرُ** | (**الشُّورَى : ١١**) .

يەكێك لە ئامادەبووان وتى : پرسيارى لێ بكە مەبەستى لە | **ٱلسَّمِيعُ ٱلْبَصِيرُ** | كێيە؟

منيش وتم : ' ئەو - **و اته الله تعالى** - بەو شێوەیەی کە خۆی فەرموویەتی تبارک و تعالى. '

---

: **لەلای هەموو جەهمیەکان، بە جەهمیەکانی سەرەتا و موعتەزیلی و ئەشعەری و ماتوریدیه زەندیقە مولحیدەکان ناکرێت مانای حەقیقی و ڕووکەشی ئایەتەکانی سیفات وەربگیرێت، چونکە قورئان و فەرمووده لەگەڵ ئەو کوفری کەلامەدا ناگونجێت کە عەقیدەیان لەسەر بنیادناوە، بەڵام لەلای سەلەف و ئەهلی سوننە الله تعالى بەو شێوەیەی کە لە قورئان و فەرموودەدا وەسفی خۆیی کردووە، وەک چۆن ئیمام أحمد ئاماژەی پێ ئەکات .**

**٤٧** - أبو الفَضل ئەڵێت :

(پاشان تاقی کرانەوە، ئەوانەی کە وەڵامیان نەدایەوە نێردران بۆ زیندان، جا وەڵامیان دایەوە تەنها چوار کەس نەبێت : باوکم رحمه الله، وە محمد بن نوح، وە عبيد الله بن عمر القواريري، وە الحسن بن حماد السجادة .

پاشان عبيد الله بن عمر، وە الحسن بن حماد السجادة وەڵامیان دایەوە، وە باوکم و محمد بن نوح مانەوە، هەربۆیە ماوەیەک لە زینداندا مانەوە .

پاشان نامەیەک لە طرسوس ـەوە هات دەربارەی گواستنەوەیان، باوکم و محمد بن نوح ڕەحمەتی الله یان لێبێت پێکەوە بە بەندکراوی گواسترانەوە لە

بەغداد، ئێمەش لەگەڵیان ڕۆیشتین تا ئەنبار، أبو بكر الأحول لە باوكمی پرسی : ئەی باوكی عبدالله، ئەگەر شمشێر بخرێتە سەر ملت وەڵام ئەدەیتەوە؟

وتی : ' نەخێر ' .

پاشان باوكم وتی : ' بردیانین تا گەیشتینە الرحبة، كاتێک لێیەوە ڕۆشتینە ژوورەوە، ئەوەش لە تاریكایی شەودا بوو، لە الرحبة دەرچوین پیاوێک پەیدا بوو وتی : كامتان أحمد بن حنبل ن؟

پێی وترا : ئەمەیە.

سەلامی لێ كردم وتی : چی ئەبێت ئەگەر لێرە بكوژرێیت و هەر لە ئێرەوە بڕۆیتە بەهەشتەوە!

پاشان سەلامی لێ كردم و ڕۆیشت.

منیش وتم : ' ئەمە كێ بوو؟ '

وترا : پیاوێكە لە ربیعة، لە عەرەب، لە دەشت و چۆڵەوانیدا شیعر ئەڵێت، پێی ئەڵێن جابر بن عامر.

كاتێک گەیشتینە أذنة چووینە ژوورەوە لە تاریكایی شەودا، دەرگاكەیمان بۆ كرایەوە، كاتێک ئێمە ئەڕۆشتینە دەرەوە لە دەرگاكە گەیشتین بە پیاوێک كە ئەهاتە ژوورەوە وتی : مژدەتان لێبێت، ئەو كابرایە مرد - و اته المأمون - .

باوكم وتی : ' داوام ئەكرد لە الله كە نەیبینم ' .

**٤٨** - أبو الفَضل ئەڵێت :

(باوکم بۆی گێڕامەوە وتی : معمر بن سليمان بۆی گێڕاینەوە لە فرات بن سليمان لە ميمون بن مهران وتی : ' سێ شن هەن بەهۆیانەوە خۆت تووشی بەڵا مەکە، مەڕۆرە لای سوڵتان و کاربەدەست ئەگەر بشڵێیت فەرمانی پێ ئەکەم بە گوێڕایەڵی الله، وە مەڕۆرە لای ئافرەتێک ئەگەر بشڵێیت فێری قورئانی ئەکەم، وە گوێ ڕامەگرە بۆ خاوەن هەوا و ئارەزوو، لەبەر ئەوەی نازانیت دڵت چ شتێکی پێوە ئەنووسێت ' ).

**٤٩** - أبو الفَضل ئەڵێت :

(باوکم و محمد بن نوح گواسترانەوە بۆ طرسوس، لە البذندون هەواڵی مردنی المأمون گەیشت، جا بە بەندکراوی گەڕێنرانەوە بۆ الرقة، وە لە الرقة بە گواسترانەوە بە کەشتی لەگەڵ کۆمەڵێک زیندانی تردا.

کاتێک گەیشتنە عنات، محمد بن نوح وەفاتی کرد و باوکم نوێژی لەسەر کرد.

پاشان بە بەندکراوی گواسترایەوە بۆ بغداد، لە الياسرية چەند ڕۆژێک مایەوە، پاشان برا بۆ زیندانی لە ماڵێک لە نزیک ماڵی عمارة، پاشان گواسترایەوە بۆ زیندانی گشتی لەسەر ڕێگای الموصلية.

لەو کاتەوەی بردرا و گواسترایەوە هەتا ئەوکاتەی لێی درا و ئازاد کرا **٢٨** مانگ لە زینداندا بوو.

باوکم وتی : ' پێشنوێژیم بۆ ئەکردن بە بەندکراوی ' .

باوکم وتی : ' ئەگەر بەندەکە ڕێگری لێ نەکات لەوەی بە تەواوی نوێژەکەی بکات ئەوە کێشەی نییە - **بە کۆت و بەندەوە نوێژ بکات** - ' ) .

**٥٠** - أبو الفَضل ئەڵێت :

(وە ئەمبینی فوران گۆزە ئاوی ساردی هەڵئەگرت و ئەیبرد بۆ زیندان بۆلای).

**٥١** - أبو الفَضل ئەڵێت :

(باوکم رحمه الله وتی ' شەوی نۆزدەی مانگی ڕەمەزان بوو کە لە زیندانەوە گواسترامەوە بۆ ماڵی إسحاق بن إبراهیم، وە بە یەک کۆت و بەند بەندکرابووم، هەموو ڕۆژێک دوو کەسی ئەنارد بۆ لام باوکم ناوی هێنان - **أبو الفَضل ئەڵێت أحمد بن رياح و أبو شعيب الحجام بوون** - ، قسە و موناقەشەیان لەگەڵ ئەکردم، هەرکاتێک بیانویستایە بەجێمبهێڵن بانگ ئەکرا کۆت و بەند بکرێم، لەسەر ئەم بار و دۆخە سێ ڕۆژ مامەوە و قاچم چوار کۆت و بەندی پێوە بوو، ڕۆژێکیان یەکێکیان دوای قسەیەک لە نێوانمان و پرسیارلێکردن دەربارەی زانستی الله پێی وتم کە زانستی الله مخلوق ە.

منيش وتم : ' ئەی كافر، كوفرت كرد ' .

پەیامبەرەكەی إسحاق كە لەگەڵیان ئامادە ئەبوو پێی وتم : ئەمە پەیامبەری پێشەوای ئیماندارانە!!

منیش وتم : ' ئەمە كافر بووە ' ) .

**٥٢** - أبو الفَضل ئەڵێت :

(باوكم وتی ' ناوەكانی اللە لە قورئاندایە، وە قورئان لە زانستی اللە تعالی یە، هەركەسێك بڵێت قورئان مخلوق ە ئەوە كافرە، وە هەر كەسێك بڵێت ناوەكانی اللە مخلوق ە ئەوە كافر بووە ' ) .

**٥٣** - أبو الفَضل ئەڵێت :

( **- ئیمام أحمد باسی ئەو كاتە ئەكات كە لەبەردەم المعتصم دا موناقەشەی كردووە -** : باوكم وتی ' كەسێك لەملاوە قسەی ئەكرد، كەسێكی تریش لەولاوە قسەی ئەكرد، منیش وەڵامی هەردووكیانم ئەدایەوە، ئەگەر باسی شتێكیان بكردایە لە الكلام، كە لە كتێبی اللە و سوننەتی رسول اللە وە لە ئەثەرێكدا نییە ئەوە ئەموت ' نازانم ئەوە چییە! ' ).

**٥٤** - أبو الفَضل ئەڵێت :

( **- ئیمام أحمد باسی ئەو شەوە ئەكات كە بە ڕۆژەكەی لە بەردەم المعتصم دا موناقەشەی كردووە -** : باوكم وتی ' بەنەخوێنی ناو بیجامەكەم دەركرد، پاشان كۆت

و بەندەکانم پێ توند کردەوە بۆ ئەوەی کاتێک بانگ کرام بۆلای بتوانم هەڵیانگرم، بە یەکێک لە سەربازەکانم وت ' پەتێکم بۆ پەیدا بکە '، پەتێکی بۆ هێنام و کۆت بەندەکەم پێ توند کردەوە، وە بەنەخوێنەکەم کردەوە ناو بیجامەکەم، بۆیە تێم کردەوە تا ئەگەر شتێکم لێ کرا ڕووت نەبمەوە ' ).

---

**: واتە جەهمیەکان سزایان داوە، ئەویش بەنەخوێنەکەی کردووەتەوە ناو بیجامەکەی و توندی کردووە بۆ ئەوەی ئەگەر لێشیان دا ترسی ئەوەی نەبێت بیجامەکەی بێتە خوارەوە و لاشەی دەربکەوێت، وشەی السراویل بەکارهاتبوو من نەمزانی بنووسم شەرواڵ یان دەرپێ یان بیجامە، بۆیە بیجامەکەم نووسی.**

**٥٥** - أبو الفَضل ئەڵێت :

(باوکم وتی : لە ڕۆژی سێیەمدا بردرام بۆلای - **واتە المعتصم** - و ئەو کۆمەڵەیەش ئامادەبوون، لە ژوورێکەوە ئەبرامە ژوورێکی تر، کۆمەڵەیەک شمشێریان پێبوو، وە کۆمەڵەیەکی دیکە قامچیان پێبوو، وە جگە لەوانە لە جل و چەک، وە ژوورەوە پڕ بوو لە سەرباز، وە لە دوو ڕۆژی پێشوودا زۆری لەوانە - **واتە لە سەرباز** - لێنەبوو.

گەیشتمە لای و وتی : (قسە و موناقەشەی لەگەڵدا بکەن).

جا دەستیان کردەوە بە موناقەشەکەی پێشوویان و قسەی زۆر کرا لە نێوانماندا، هەتا ئەو کاتەی کە خۆی بە تەنها تیایدا ئەمایەوە و منی دوور خستەوە.

پاشان کۆبوونەوە و ڕاوێژی پێ کردن، پاشان دووری خستنەوە.

من و عبدالرحمن ی بە تەنها بانگ کرد و پێی وتم : (ماڵت ئاوابێت أحمد، والله من بەسۆزم بۆت، من بەزەییم پێتدا دێتەوە وەک چۆن بەزەییم بە هارون ی کوڕمدا دێتەوە، کەوابێت وەڵامم بدەرەوە).

پێم وت : (ئەی پێشەوای ئیمانداران، شتێکم پێ بدەن لە کتێبی الله و سوننەتی پێغەمبەر ﷺ).

کاتێک دانیشتنەکە درێژەی کێشا و قەڵس بوو پێم وتی : (لەعنەتی الله ت لێبێت، تەماحی ئەوەم تێتدا هەبوو - وەڵامم بدەیتەوە -، ڕایکێشن و بیبەن).

ڕایانکێشام و بردیانم، پاشان وازیان لێهێنام.

دواتر وتی : (دار و قامچیەکان).

دار و قامچیەکانیان هێنا.

- پاشان ئیمام أحمد باسی سزادانەکەی ئەکات ئەڵێت - :

پاشان بردرامە نێوان دوو دارەوە و دەستەکانم بەسترانەوە، کورسیەکی هێنا و لەسەر دانیشت - واتە المعتصم -، وە إبن أبي دوأد لە ڕاسەریەوە وەستابوو،

وه ئامادەبووانیش هەموویان بەپێوە بوون، کەسێک لەوانەی کە بەستبوومیەوە وتی : (یەکێک لەو دوو دارە بە توندی بگرە)، من تێنەگەیشتم چی وت، کاتێک تووند دەستی بەستم وازی لێ هێنام و منیش هیچکام لە دارەکانم نەگرت.

أبو الفَضل ئەڵێت : (باوکم ڕەحمەتی الله ی لێبێت هەتا وەفاتی کرد ئازاری بەدەست ئەوەوە ئەچەشت).

- **پاشان ئیمام أحمد درێژە بە باسەکە ئەدات** - : پاشان بە جەللادەکانی وت : (دەست پێ بکەن)، پاشان تەماشای قامچیەکەی کرد و وتی : (دانەیەکی تر بهێنن)، پاشان وتی : (دەست پێ بکەن).

بە یەکێکیانی وت : (لێی نزیک ببەرەوە، ئازاری پێ بگەیەنە دەست بە بڕین بچێت).

جا هاتە پێشەوە و دوو قامچی لێدام و پاشان هاتە دواوە.

بە یەکێکی تری وت : (لێی نزیک ببەرەوە، ئازاری پێ بگەیەنە دەست بە بڕین بچێت).

جا هاتە پێشەوە و دوو قامچی لێدام و پاشان هاتە دواوە.

---

**: المعتصم چەندین جەللادی ئامادە کردبوو، وە بە سەرە یەکی دوو قامچیان لێ ئەدا بۆ ئەوەی جەللادەکانی هیلاک نەبن و لێدانەکانیان بەهێزبێت.**

بەردەوام بوو یەکە یەکە فەرمانی پێئەکردن، ئەوانیش دوو قامچیان لێ ئەدام و ئەهاتنە دواوە، پاشان هەستا و هات بۆلام و ئەوانیش هەموویان لە چواردەوری بوون، وتی : (ماڵت ئاوا بێت أحمد، ئەوە خۆت بە کوشتن ئەدەیت! ماڵت ئاوا بێت وەڵامم بدەرەوە با بە دەستی خۆم ڕزگارت بکەم).

هەندێکیان پێیان وتم : (وەیل بۆ تۆ، پێشەواکەت وا لە ڕاسەرت وەستاوە)

عجیف نووکی شمشێرەکەی چەقاندە لەشم و وتی : (ئەتەوێت بەسەر هەموو ئەوانەدا زاڵ ببیت؟!) .

إسحاق بن إبراهیم وتی : (ماڵت ئاوا بێت خەلیفە بە ڕاسەرتەوە وەستاوە)

هەندێکیشیان ئەیانوت : (ئەی پێشەوای ئیمانداران خوێنەکەی لە ملی من).

پاشان گەڕایەوە و دانیشت لەسەر کورسیەکەی و وتی : (لێی نزیک ببەرەوە، ئازاری پێ بگەیەنە دەست بە بڕین بچێت).

ئیتر هەر بەردەوام بوو لە بانگکردنی جەللاد لە پاش جەللاد تا دوو قامچیم لێبدەن و وازم لێبهێنن، وە ئەیوت : (توند بە، دەستت بە بڕین بچێت).

- **پاش ئەشکەنجەدانی ئیمام أحمد لەلایەن جەهمیەکانەوە ئەڵێت :** - هۆشم لەلای خۆم نەما، کاتێک هۆشم هاتەوە لە ژوورێکدا بووم، کۆت و بەندەکەم لێ

کرابوویەوە، یەکێک لە ئامادەبووان وتی ' لەسەر ڕووخسارت ڕامانکێشایت، پاشان لەسەر پشت خستمانیتە سەر حەسیرێکی زبر'

منیش وتم : ' هەستم بە هیچ شتێک لەوانە نەکردووە ' .

پاشان شۆربایەکیان بۆ هێنام وتیان : ' بیخۆ ' .

وتم : ' ڕۆژووەکەم ناشکێنم ' .

**٦٥** - أبو الفَضل ئەڵێت :

(پاشان بردرا بۆ ماڵی إسحاق بن إبراهیم.

باوکم وتی : ' بانگی نوێژی نیوەڕۆ درا، پاشان نوێژی نیوەڕۆمان کرد ' .

إبن سماعة وتی : ' ئەوە نوێژ ئەکەیت و خوێن لە برینەکەت دێتە دەرەوە؟!
' .

وتم : ' عمر بن الخطاب نوێژی ئەکرد و برینەکەت خوێنی لێدەچۆڕا '

جا بێدەنگ بوو.

**- پاشان صالح باسی ئەو کاتە ئەکات کە پزیشک هاتووە بۆلای تا چارەسەری بکات و بەشێک لە گۆشتەکەی بەهۆی لێدانەوە گەنیوە -** : پێی وت : ' ئەمەوێت ئەم بەشە ببڕم
' .

پاشان پارچە ئاسنێکی هێنا، بە پارچە ئاسنەکە گۆشتەکەی ئەگرت و بە چەقۆیەک گۆشتەکەی ئەبڕی، وە باوکم ئارامگر بوو لەسەری و سوپاسی اللە ی ئەکرد.

وە بەردەوام ئەو برینانە ئێش و ئازاری هەبوو، وە شوێنەواری لێدانەکە دیار بوو لە پشتیدا هەتا ئەو کاتەی وەفاتی کرد ڕەحمەتی اللە ی لێبێت) .

**٦٦** - أبو الفَضل ئەڵێت :

(پاشان یەکێک لەو دوو کەسەی لەگەڵی بوون پێی وتم، وە ئەم کەسە هاوەڵی فەرموودە بوو، فەرموودەی گوێلێبووبوو بەڵام پاش ئەوە لوتبەرزی و کیبری نواند : ' ئەی برازاکەم، ڕەحمەتی اللە لە أبو عبداللە بێت، سوێند بە اللە هیچ کەسێکم نەبینیوە وەکو ئەو بێت، کاتێک خواردنیان بۆ ئەهێناین پێم ئەوت : ئەی أبو عبداللە، تۆ بەڕۆژوویت، وە لە حاڵەتی توقیەدایت.

تینووی بوو، جا بە خزمەتکارەکەی وت ' ئاوم پێ بدە '، ئەویش گۆزەیەکی داپێ بەفر و ئاوی تێدا بوو، لێی وەرگرت و تۆزێک تەماشای کرد، پاشان گەڕاندیەوە بۆی .

منیش زۆر سەرسام بووم بەو ئارامگریەی لەسەر برسێتی و تینووێتی لەگەڵ ئەو حاڵە ناخۆشەی کە تێیدایەتی.

**٦٧** - أبو الفَضل ئەڵێت :

(لەو ڕۆژانەدا هەوڵم ئەدا خواردنێک یان پارچەیەک یاخود دوو پارچە نانی پێ بگەیەنم، بەڵام نەمتوانی).

**٦٨** - أبو الفَضل ئەڵێت :

(کەسێک لە ئامادەبووان هەواڵی پێدام وتی ' لەو سێ ڕۆژەی کە موناقەشەیان لەگەڵ کرد غەریبم ئەکرد، جا هەڵوێستی نەگۆڕا، وە پێم وا نییە هیچ کەسێک هەبێت وەکو ئەو بوێر بێت و دڵی بەهێز بێت ').

**٦٩** - أبو الفَضل ئەڵێت :

باوکم بۆی گێڕامەوە وتی : گوێم لە عبدالرحمن بن مهدي بوو کاتێک باسی بشر المريسي لەلا کرا وتی : (هەرکەسێک بڵێت الله تبارک و تعالی قسەی لەگەڵ موسی دا نەکردووە ئەوە کافرە، تۆبەی پێ ئەکرێت، ئەگەر تۆبەی نەکرد لە ملی ئەدرێت).

**٧٠** - أبو الفَضل ئەڵێت :

باوکم بۆی گێڕامەوە وتی : گوێم لە إسماعيل بن علية بوو وتی : (هەر کەسێک بڵێت قورئان مخلوق ە ئەوە بیدعەچیە).

---

: واتە بیدعەی کوفری.

**٧١** - أبو الفَضل ئەڵێت :

باوكم وتی : (هەركەسێک بڵێت قورئان مخلوق ـە ئەوە كافر بووە، وە هەر كەسێک بڵێت ناوەكانی اللە دروستكراون كافر بووە، نوێژ ناكرێت لە پشتی ئەو كەسەی ئەڵێت قورئان مخلوق ـە، ئەگەر كەسێک نوێژی - لە پشت كرد - ئەوە ئەیگێڕێتەوە).

**٧٢** - الحارث بن عباس ئەڵێت :

وتم بە أبي مسهر : ئایا هیچ كەسێک ئەناسیت مابێتەوە دینی ئەم ئوممەتە بپارێزێت؟

وتی : (نەخێر كەس ناناسم تەنها گەنجێک نەبێت لە بەشی ڕۆژهەڵاتەوە).

---

: مەبەستی ئیمام أحمد ـە رحمهم الله

**٧٣** - أبو الفَضل ئەڵێت :

باوكم وتی : (ناوەكانی اللە لە قورئاندان، وە قورئان لە عیلمی اللە یە، وە عیلمی اللە مخلوق نییە، وە قورئان كەلامی اللە یە و مخلوق نییە لە هەموو ڕوویەكەوە و بە هەموو جۆرێک و لە هەموو حاڵەتێک).

**٧٤** - وترا بە أبو عبدالله : (كۆمەڵێک هەن ئەگەر كەسێک بڵێت : كەلامی الله مخلوق نییە، پێی ئەڵێن : ئیمامت كێیە لەمەدا؟ وە لە كوێوە وتت مخلوق نییە؟).

وتی : (بەڵگە وتەی الله تبارک و تعالی یە : ﴿**فَمَنْ حَآجَّكَ فِيهِ مِنۢ بَعْدِ مَا جَآءَكَ مِنَ ٱلْعِلْمِ**﴾ (آلِ عِمرَان : ٦١) جا تەنها قورئانی بۆ هات).

**٧٥** - أبو الفَضل ئەڵێت :

باوكم وتی : (قورئان لە عیلمی الله یە، وە عیلمی الله مخلوق نییە، وە نموونەی ئەمە زۆرە لە قورئاندا).

**٧٦** - پێی وترا : ئایا هیچ یەكێک لە زانایان وتوویانە مخلوق نییە؟

وتی : (جعفر بن محمد).

---

**: جعفربن محمد بن علي بن الحسين بن علي بن أبي طالب، ناسراوبە الصادق، ساڵی ١٤٨ هـ وەفاتی كردووە .**

**٧٧** - أبو الفَضل ئەڵێت :

باوكم بۆی گێڕامەوە - **بەسەرمدا خوێندیەوە لە كتێبەكەیەوە** - : موسى بن داود بۆی گێڕاینەوە وتی : أبو عبدالرحمن معبد بۆی گێڕاینەوە لە معاوية بن عمار

الدهني وتی : وتمان به جعفر بن محمد : ئەوانە پرسیارمان لێ ئەکەن دەربارەی قورئان کە ئایا مخلوق ە؟

وتی : (نە خالق ە، وە نە مخلوق ە، بەڵکو کەلامی الله یە).

**٧٨** - أبو الفَضل ئەڵێت :

گوێم لە أبا عبدالله جعفر بن عبدالواحد بوو وتی : گوێم عبدالأحد بن عبدالرحمن بوو وتی : گوێم لە المعافى بوو وتی : گوێم لە الأوزاعي بوو وتی : (الزهري و مكحول ئەیانوت کەلامی الله یە و مخلوق نییە).

**٧٩** - أبو الفَضل ئەڵێت :

وتم بە باوکم هەر کەسێک بڵێت لفظ م بە قورئان مخلوق ە، ئایا قسەی لەگەڵ ئەکرێت؟

وتی : (ئەوە قسەی لەگەڵ ناکرێت و نوێژی لە پشتەوە ناکرێت، وە ئەگەر کەسێک نوێژی کرد لە پشتیەوە ئەیگێڕێتەوە).

**٨٠** - أبو الفَضل ئەڵێت :

يعقوب بن إبراهيم الدورقي پرسیاری لە باوکم کرد دەربارەی کەسێک بڵێت لفظ ی بە قورئان مخلوق ە، وە چی ئەڵێت دەربارەیان؟

وتی : (ئەوانە قسەیان لەگەڵدا ناکرێت، وە لەو بابەتەدا قسەیان لەگەڵدا ناکرێت، قورئان کەلامی الله یە و غیر مخلوق ە لە هەموو ڕوویەکەوە، وە بە هەموو شێوەیەک، وە لە هەموو بارودۆخێکدا).

**٨١** - أبو الفَضل ئەڵێت :

(پێم گەیشتەوە کە أبا طالب لە باوکمەوە گێڕاویەتیەوە کە ئەڵێت : لفظ م بە قورئان غیر مخلوق ە، جا هەواڵم دا بە باوکم.

وتی : (ئەمە کێ پێی وتیت؟).

وتم : فڵانە کەس.

وتی : (بنێرە بەدوای أبا طالب دا).

منیش بەدوامدا نارد، جا ئەو هات، وە فوران یش هات.

باوکم شوێنی بەخۆی نەئەگرت و بە تووڕەییەوە پێی وت : (من وتوومە لفظ م بە قورئان غیر مخلوق ە؟)

- **أبا طالب** - پێی وت : (من ئەمەم بەسەرتدا خوێندەوە : ﴿ **قُلۡ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ** ﴾، بە منت وت کە ئەمە مخلوق نییە).

وتی : (ئەی باشە بۆ لە منەوە گێڕاوتەتەوە کە وتوومە لفظ م بە قورئان غیر مخلوق ە؟، وە پێم گەیشتووە لە نامەکەتدا ئەمەت نووسیوە، وە نووسیوتە بۆ کۆمەڵێک خەڵک، جا ئەگەر لە نامەکەتدا بووە ئەوە بە توندترین

سڕینەوە بیسڕەرەوە، وە بنووسە بۆ ئەو کۆمەڵەیەی کە پێشتر بۆت نووسیبوون کە من ئەمەم پێ نەوتوویت).

زۆر تووڕە بوو، وە ڕووی تێ کرد : (شتێکم لێوە ئەگێڕیتەوە کە خۆم پێم نەوتوویت؟).

فوران هەر خەریکی پۆزش هێنانەوە بوو بۆی - واتە بۆ أبو طالب - .

ئەوی بەجێهێشت و زۆر ترسابوو، پاشان أبو طالب گەڕایەوە و وتی کە سڕیویەتیەوە لە کتێبەکەی، وە نووسیویەتی بۆ ئەو کۆمەڵەیە کە لێی تێکچووە ئەو شتەی گێڕاوەتەوە لە أبو عبدالله ـەوە.

**٨٢** - أبو الفَضل ئەڵێت :

گوێم لە باوکم بوو وتی : جەهمیەکان دابەش بوون بەسەر سێ کۆمەڵەدا

کۆمەڵەیەکیان وتیان : قورئان مخلوق ـە.

وە کۆمەڵەیەکی تریان وتیان : کەلامی الله ـە، وە بێدەنگ ئەبین.

کۆمەڵەیەکی دیکەیان وتیان : لفظ مان بە قورئان مخلوق ـە.

الله عز وجل لە قورئاندا ئەفەرموویت : ﴿فَأَجِرْهُ حَتَّىٰ يَسْمَعَ كَلَٰمَ ٱللَّهِ﴾ (التَّوبَة : ٦) .

جا جبريل بيستوويەتی لە الله، وە پێغەمبەر ﷺ بيستوويەتی لە جبريل عليه السلام، وە هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ لە پێغەمبەريان بيستووە، كەواتە قورئان كەلامی الله يە و مخلوق نييە).

**٨٣** - أبو الفَضل ئەڵێت :

وتم بە باوكم ئايا قسە ناكرێت لەگەڵ ئەوەی ئەوەستێت لە قورئاندا؟

وتی : (قسەی لەگەڵدا ناكرێت).

وتم : ئەی ئەگەر كەسێک قسەی لەگەڵدا كرد؟

وتی : (فەرمانی پێ ئەكەيت، ئەگەر وازی لە قسەكردن لەگەڵی هێنا ئەوە قسەی لەگەڵ بكە، وە ئەگەر وازی لە قسەكردن لەگەڵی نەهێنا قسەی لەگەڵدا مەكە).

**٨٤** - أبو الفَضل ئەڵێت :

(باوكم وتی : ' ئەگەر تاقيكرايەوە، ئەوە وەڵام ناداتەوە، وە لەلای من زۆرلێكراو كەسێكە كە لێی درابێت و سزای درابێت، بەڵام هەڕەشەلێكراو بە هەڕەشەلێكرانی لەلای من نابێت بە زۆرلێكراو، لەبەر ئەوەی ئەو ئايەتەی الله تێيدا فەرمووی | **إِلَّا مَنْ أُكْرِهَ وَقَلْبُهُۥ مُطْمَئِنٌّۢ بِٱلْإِيمَـٰنِ** | دەربارەی عمار دابەزی، وە عمار سزا درا ').

: وتەی (ئەگەرتاقیکر ایەوە، ئەوە وەڵام ناداتەوە) و اتە ئەگەربانگ کرا بۆئەوەی بڵێت قورئان مخلوق ە ئەوە نابێت وا بڵێت .

**٨٥** - أبو الفَضل ئەڵێت :

(باوکم زەرپی دا لە فەرموودەی هەموو ئەوانەی کە وەڵامیان دایەوە).

**٨٦** - أبو الفَضل ئەڵێت :

(إبن رياح هاتە بەغداد و بەتەمای بەسرە بوو، جا پێی گەیشت - **واتە بە ئیمام أحمد** - کە عبيدالله القواريري ڕۆشتووە بۆ لای یان سەلامی لێ کردووە، جا القواريري هات بۆ لای باوکم، کاتێک تەماشای کرد وتی : ' ئەوە وەڵامدانەوەکەت بەس نەبوو هەتا سەلامت لە إبن رياح کردا! '، وە دەرگاکەی داخستەوە بەسەریدا.

وە الحزامي هات، لەوانەبوو کە چووبوو بۆ لای إبن أبي دؤاد، تەقەی دا لە دەرگا، کاتێک چووە دەرەوە و بینی دەرگاکەی داخست و هاتە ژوورەوە).

---

: إبن رياح و إبن أبي دؤاد دوو قازی جەهمی بووم لعنهم الله.

**٨٧** - أبو الفَضل ئەڵێت :

(باوکم وتی : ' پیاو نابێت شایەتی بدات لەلای قازیەکی جەهمی ' ).

**٨٨** - أبو الفَضل ئەڵێت :

(پرسیار کرا لە باوکم دەربارەی پیاوێک کە کەسێکی تری کردووە بە شایەت لەسەر شتێک، پاشان داوای لێ ئەکات لەلای قازی شایەتی بۆ بدات، وە قازیەکەش جەهمیە؟

وتی : ' ناڕوات بۆ لای ' ) .

**٨٩** - أبو الفَضل ئەڵێت :

(پرسیم لە باوکم : ئایا کەسێک نوێژ بکات لە پشت قەدەریەکەوە؟

وتی : ئەگەر - **قەدەریەکە** - وتی الله زانستی نییە بەوەی بەندەکانی چی ئەکەن هەتا بەندەکانی کارەکە ئەکەن، ئەوە نوێژی لە پشتەوە ناکرێت.

وە باوکم وتی : نوێژ ناکرێت لە پشتی رافضیەکەوە ئەگەر هاوەڵانی رسول الله ﷺ عەیبدار بکات) .

**٩٠** - أبو الفَضل ئەڵێت :

وتم بە باوکم : لە پێشخستندا چ شتێک هەڵئەبژێریت؟

وتی : (فەرموودەکەی إبن عمر).

وتم : ئايا فەرموودەكەی سفينة هەڵئەبژێريت؟

وتی : (بەڵێ، هەردوو فەرموودەكە بەكارئەهێنين، فەرموودەكەی سفينة بريتيە لە (خيلافەت سی ساڵە)، جا أبو بكر دوو ساڵ و شتێک خەليفە بوو، وە عمر دە ساڵ، وە عثمان دوازدە ساڵ، وە عەلی ش شەش ساڵ رضوان الله عليهم).

**٩١** - أبو الفَضل ئەڵێت :

ئامادە بووم كاتێک پرسياری لێ كرا دەربارەی كەسێک كە علي پێش ئەخات بەسەر عثمان دا، ئايا تەبديع ئەكرێت؟

وتی : (ئەوە شايەنيەتی تەبديع بكرێت، هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ عثمان يان پێشخست).

**٩٢** - أبو الفَضل ئەڵێت :

باوكم بۆی گێڕامەوە وتی : أبو سلمة الخزاعي بۆی گێڕاينەوە وتی : (حماد بن زيد جياوازی ئەكرد لە نێوان ئيمان و ئيسلام دا، ئيسلامی بە گشتی دائەنا، وە ئيمان بە تايبەت).

**٩٣** - أبو الفَضل ئەڵێت :

باوكم وتی : (ئەگێڕدرێتەوە لە أبي جعفر كە ئەڵێت : ئیمان بچووككراوەیە لەناو ئیسلامدا، ئەگەر - **كەسێک** - زینای كرد ئەوە لە ئیمان ەوە دەرئەچێت بۆ ئیسلام).

**٩٤** - أبو الفَضل ئەڵێت :

باوكم وتی : (ئیمان وتە و كردەوەیە، زیاد ئەكات و كەم ئەكات).

**٩٥** - أبو الفَضل ئەڵێت :

باوكم وتی : گوێم لە يحيى بن سعيد القطان بوو وتی : (سفیان بن سعید ڕێگری ئەكرد لەوەی - **كەسێک** - بڵێت من ئیماندارم.

وە يحيى زیاد كردن و كەم بوونەوەی - ئیمانی - بەباش دانا و بۆچوونی وا بوو) .

**٩٦** - أبو الفَضل ئەڵێت:

باوكم وتی : أبو نعیم وتی : گوێم لە سفیان بوو ئەیوت : (ئیمان زیاد و كەم ئەكات).

**٩٧** - أبو الفَضل ئەڵێت :

باوكم وتى : گوێم لە وكيع بوو وتى : (ئيمان زياد و كەم ئەكات)، وە سفيان يش هەمان قسەى ئەكرد.

**٩٨** - أبو الفَضل ئەڵێت :

باوكم وتى : إبراهيم بن شماس بۆى گێڕاینەوە وتى : جرير بن عبدالحميد ئەڵێت : (ئيمان زياد و كەم ئەكات).

**٩٩** - أبو الفَضل ئەڵێت :

باوكم وتى : إبراهيم بن شماس بۆى گێڕاینەوە وتى : عبدالله بن المبارك ئەڵێت : (ئيمان پلەبەندى هەيە).

**١٠٠** - أبو الفَضل ئەڵێت :

باوكم وتى : إبراهيم بن شماس بۆى گێڕاینەوە وتى : گوێم لە يحيى بن سليم بوو وتى إبن جريج وتى : (ئيمان وتە و كردەوەيە).

**١٠١** - أبو الفَضل ئەڵێت :

باوكم وتى : سريج هەواڵى پێداين وتى : عبدالله بن نافع هەواڵى پێدام وتى : (مالك ئەيوت ئيمان وتە و كردەوەيە).

**١٠٢** - أبو الفَضل ئەڵێت :

باوكم وتی : إبن شماس بۆی گێڕاینەوە وتی : گوێم لێبوو پرسیار دەربارەی ئیمان لە فضیل بن عیاض كرا وتی : (ئیمان لەلای ئێمە لە ناوەوە و دەرەوەشە، دانپێدانانە بە زمان، وە قبووڵكردنە بە دڵ، وە كارپێكردنیەتی).

---

**: (وە كارپێكردنیەتی) واتە كار بكەیت بەوەی كە بە زمان وتووتە و بە دڵ قبووڵت كردووە .**

**١٠٣** - أبو الفَضل ئەڵێت :

باوكم وتی : أبو سلمة الخزاعي بۆی گێڕاینەوە وتی : (مالك و شريك و أبو بكر بن عياش و عبدالعزيز بن أبي سلمة و حماد بن سلمة و حماد بن زيد وتیان : ئیمان بریتیە لە ناسین، وە دانپێدانان، وە كاركردن).

**١٠٤** - أبو الفَضل ئەڵێت :

باوكم وتی : إبراهيم بن شماس بۆی گێڕاینەوە وتی : (گوێم لە إبن المبارك و جرير بن عبدالحميد و يحيى بن سليم و النضر بن شميل و بقية بن الوليد و أبو إسحاق الفزاري و إسماعيل بن عياش بوو وتیان : ئیمان وتە و كردەوەیە).

**١٠٥** - أبو الفَضل ئەڵێت :

(باوكم له دەرچوونەكەیدا بۆ العسكر نوێژی كورت ئەكردەوە).

---

**: (العسكر) شوێنێک بوو كه المتوكل داوای له ئیمام كرد بڕوات بۆی.**

**١٠٦** - أبو الفَضل ئەڵێت :

(باوكم وتی ئەگەر ڕێگەكه چوار بُرد درێژ بوو ئەوا نوێژ تێیدا كورت ئەكرێتەوە، ئەوەش ئەكاته شازده فەرسەخ).

---

**: هەرفەرسەخێک نزیكەی پێنج كیلۆمەترونیوه .**

**١٠٧** - أبو الفَضل ئەڵێت :

(جارێكیان نوێژی عەسر پێشنوێژیم كرد، پێی وتم : نوێژە عەسرەكەت لێ درێژ كردینەوە، له هەر ڕكعاتێكدا پازده ئایەت بخوێنه).

---

**: واته له سەفەردا هەم نوێژەكه كورت ئەكرێتەوە، هەم قورئانی كەمیش ئەخوێندرێت، والله أعلم .**

**١٠٨** - أبو الفَضل ئەگێڕێتەوە :

**- كاتێك ئیمامی أحمد لەلای المعتزی كوڕی المتوكل دێتەوە ئەڵێت -** : (كاتێک هاتە ژوورەوە جلەكانی داكەند و دەستی كرد بە گریان، وتی : ئەوە شەست ساڵە من لەوانە پارێزراوم، كەچی ئێستا لە كۆتایی تەمەنمدا تووشم بوون! وا دانانێم سەلامەت بووبم لە چوونم بۆ لای ئەم منداڵە **- واتە المعتز -**، چجای بگات بە كەسێک كە لەو كاتەی ئەڕۆمە لای تا ئەو كاتەی دەرئەچم ئەبێت ئامۆژگاری بكەم؟! **- واتە المتوكل -**

**١٠٩** - أبو الفَضل ئەگێڕێتەوە :

**- ئیمام أحمد پێش چوونی بۆ لای كوڕی خەلیفە جلێكی تایبەتی بۆ ئامادەكرابوو لەبەری بكات -** پاشان وتی : (صالح ئەم جل و بەرگە بنێرەرەوە بۆ بەغداد با بفرۆشرێت و پارەكەی بكرێت بە خێر، وە ئێوەش لە پارەكەی هیچ شتێک بۆ خۆتان نەكڕن).

**١١٠** - أبو الفَضل **- باسی ئەوكاتە ئەكات كە لە میوانداری خەلیفە بوون -** ئەڵێت:

(سێ ڕۆژ لەسەر یەک بەڕۆژوو ئەبوو بە خواردنی خورما و شۆربا، بەو شێوەیە پازدە ڕۆژ بەردەوام بوو، وە سێ ڕۆژ جارێک ڕۆژووی ئەشكاند، پاش ئەوە هەموو شەو نا شەوێک ڕۆژووی ئەشكاند، وە ڕۆژووی تەنها بە پارچە نانێک ئەشكاند).

**١١١** - أبو الفَضل ئەڵێت :

- لەبەر ئەوەی پیر و نەخۆش بووە هەموو ڕۆژێک المتوکل پزیشکی ناردووە بۆ لای - (هەموو ڕۆژێک إبن ماسویە ی ئەنارد بۆ لای، تەماشای ئەکرد و ئەیوت : ئەی باوکی عبداللە، من مەیلم هەیە بۆ تۆ و هاوەڵەکانت، وە هیچ نەخۆشیەکت نییە ئیللا سستی و کەمی ئیسراحەتکردن نەبێت).

**١١٢** - أبو الفَضل ئەڵێت :

- یعقوب ی نێردەی المتوکل دێت بۆ لای - (یعقوب وتی : ئەی باوکی عبداللە، پێشەوای ئیمانداران تامەزرۆی بینینتە، وە ئەڵێت : (بزانە کەی دێت بۆ لام؟)، چ ڕۆژێکە تا پێی ڕابگەیەنم؟

وتی : ئەوە عایدی خۆتانە).

**١١٣** - أبو الفَضل - باسی ئەوکاتە ئەکات کە لە میوانداری خەلیفە بوون - ئەڵێت:

(جومعە بۆ جومعە خەتمێکی ئەکرد، کاتێک خەتمەکەی تەواو بکردایە بانگی ئەکردین، ئەو دوعای ئەکرد ئێمەش ئەمانوت ئامین).

**١١٤** - أبو الفَضل ئەڵێت :

باوکم وتی : (سوێند بە اللە هیوای مردنم ئەخواست لەو ڕووداوەی پێشوودا - واتە لە فیتنەی خەلقی قورئاندا -، وە من لەم حاڵەتە و ئەوی تریش ئاواتەخوازی مردنم، ئەمە فیتنەی دنیایە، ئەوی تریش فیتنەی دین بوو).

پاشان دەستەکانی کرد بەناو یەکدا و وتی : (ئەگەر ڕۆحم بەدەست خۆم بووایە ئەوە دەرم ئەکرد) پاشان پەنجەکانی لەیەک ئەکردەوە.

**١١٥** - أبو الفَضل ئەڵێت :

(وەسیەتێکی کرد - **واتە ئیمام أحمد** -، بسم الله الرحمن الرحيم، ئەمە وەسیەتی أحمد بن حنبل ە، وەسیەتی کردووە کە شایەتی ئەدات بەوەی هیچ پەرستراوێکی بەحەق نییە تەنها الله نەبێت، تاک و بێهاوتایە و هاوەڵی نییە، وە محمد ﷺ بەندە و نێردراویەتی، ناردوویەتی بە هیدایەت و دینی حەق بۆ ئەوەی سەری بخات بەسەر هەموو دینەکانی تردا ئەگەرچی موشریکەکانیش پێیان ناخۆش بێت.

وە وەسیەتی کردووە بۆ ئەوانەی لە بنەماڵە و خزمەکانی کە گوێڕایەڵی ئەکەن الله بپەرستن و لە خواپەرستەکان بن، وە شوکرانەبژێری بکەن و لە شوکرانەبژێرەکان بن، وە دڵسۆزبن بۆ کۆمەڵی موسوڵمانان.

وە وەسیەت ئەکەم بەوەی ڕازیم الله پەروەردگارم بێت، وە ئیسلام دینم بێت، وە محمد ﷺ پێغەمبەرم بێت).

**١١٦** - أبو الفَضل ئەڵێت :

**- المتوكل پارەی مانگانە ئەبرێتەوە بۆ ئیمام أحمد و بنەماڵەکەی، ئیمام أحمد قبووڵی ناکات، وە فەرمان بە کوڕەکانیشی ئەکات پارەکە وەرنەگرن** - باوکم پێی وتم : (ئەی صالح

وتم : بفەرموو لە خزمەتدام.

وتی : (حەز ئەکەم واز لەو پارەیە بهێنیت، وەری مەگرە، وە مەیدە بە کەسی تریش، چونکە ئەزانم ئێوە بەهۆی منەوە وەری ئەگرن).

من هیچ قسەیەکم نەکرد.

پێی وتم : (ئەوە چیتە؟).

وتم : حەزناکەم بە دەم شتێکت پێ بڵێم، بەڵام دواتر پێچەوانەکەی ئەنجام بدەم، بەو شێوەیە وام لێ دێت درۆ و دووڕوویم لەگەڵ کردبیت، لە بنەماڵەکەشدا کەسی تێدا نییە ئەوەندەی من منداڵی هەبێت و پێویستی پێی بێت، وە من پێشتر شەکوای حاڵی خۆم ئەهێنایە لات و ئەتوت : (بارودۆخی تۆ بە باردودۆخی منەوە بەستراوە، بەڵکو الله ئەم بارودۆخەم لەسەر لاببات)، وە دوعات بۆ ئەکردم، جا داواکارم الله وەڵامی دابێتیتەوە.

وتی : (واتە ئەوە ناکەیت کە پێت ئەڵێم؟!).

وتم : نەخێر.

وتی : (هەستە الله ئاوا و ئاوات لێ بکات).

وە فەرمانی کرد بە گرتنی ئەو درگایەی لە نێوان من و ئەودایە، جا عبدالله پێم گەیشت و پرسیاری کرد، منیش تێمگەیاند، وتی : ئەی من چی بڵێم؟

وتم : ئەوەیان عایدی خۆتە.

جا هەمان شتی منی بە ئەویش وت، ئەویش وتی : نەخێر.

جا هەمان كاری منی لەگەڵ ئەویش كرد . . . وە هەجری كردین و دەرگای نێوان ماڵی خۆی و ئێمەی داخست، وە ئاگاداری دا لەوەی شتێک لە ماڵی ئێمە بڕواتە ماڵی).

**١١٧** - أبو الفَضل ئەڵێت :

**- صالح باسی كۆتاییەكانی تەمەنی باوكی ئەكات -** (شەوانە لە پەنایدا ئەخەوتم، ئەگەر شتێكی بویستایە پێی ئەوتم، منیش بۆم ئەكرد.

وە هەمیشە زمانی ئەجووڵاند - بۆ ذیكر كردن. -

وە هەرگیز بەهۆی نەخۆشیەوە نەیناڵاندووە تەنها ئەو شەوە نەبێت كە تێیدا وەفاتی كرد.

وە هەر بە پێوە نوێژی ئەكرد، ڕام ئەگرت و ئەویش ڕكوع و سوجدەی ئەبرد، وە بەرزم ئەكردەوە لە ڕكوعەكەی.

وە هەمیشە مێشكی لەلای خۆی بوو.

لە ڕۆژی جومعە، دوازدەی مانگی ربيع الأول، دوای دوو سەعات لە هەڵهاتنی خۆر وەفاتی كرد ڕەحمەتی الله تعالى ی لێبێت).

١ - أبو الفَضل ئەڵێت :

باوكم بۆی گێڕامەوە وتی : زيد بن حباب بۆی گێڕاينەوە وتی : عياش بن عقبة بۆی گێڕاينەوە وتی : (پێم گەيشتووە كە عمر بن عبدالعزيز زۆر ئەيوت ' اللَّهُمَّ سَلِّم سَلِّم ').

: (اللَّهُمَّ سَلِّم سَلِّم) واتە ئەی پەروەردگارم بمپارێزە بمپارێزە.

٢ - أبو الفَضل ئەڵێت :

(باوكم بەنياز بوو بڕوات بۆ مەككە بە مەبەستی ئەنجامدانی حەج، وە يحيى بن معين هاوسەفەری بوو.

باوكم پێی وت : (إن شاء الله ئەڕۆين حەجەكەمان ئەكەين، پاشان ئەڕۆين بۆ صنعاء بۆ ئەوەی گوێبيستی عبدالرزاق بين).

باوكم وتی : چووينە مەككەوە، پاشان تەوافی گەيشتن بە كەعبەمان كرد، عبدالرزاق يش لەناو خەڵكيدا تەوافی ئەكرد، يحيى بن معين ناسيەوە چونكە پێشتر بينيبووی، پاش ئەوەی عبدالرزاق تەوافەكەی تەواو كرد ڕۆيشت و لە پشت المقام ەوە دوو ڕكعات نوێژی كرد پاشان دانيشت، ئێمەش تەوافی خۆمان كرد و دواتر دوو ڕكعات نوێژمان لە پشت المقام ەوە كرد، يحيى بن معين هەستا

و ڕۆیشت بۆ لای عبدالرزاق و سەلامی لێ کرد و پێی وت : ئەمە أحمد بن حنبل ی براتە.

وتی : الله جێگیری بکات، ئەوەی پێم ئەگات دەربارەی هەمووی شتی جوان و باشە.

یحیی پێی وت : إن شاء الله بەیانی دێین بۆ لات تا لێتەوە ببیستین و بنووسینەوە.

دوای ئەوە عبدالرزاق هەستا و ڕۆیشت.

باوکم بە یحیی بن معین ی وت : (بۆچی مۆعیدت لە شێخ وەرگرت؟).

یحیی وتی : بۆ ئەوەی گوێبیستی بین، الله مانگێک چوون و هاتن و پارەی ڕێگەی بۆ گەڕاندیتەوە.

باوکم وتی : (من نیەتێکم هێناوە و الله تعالى ئەمبینێت، نیەتەکەم تێکنادەم بەوەی کە تۆ ئەیڵێیت، ئەچین بۆ لای).

جا چوون بۆ لای لە الصنعاء گوێبیستی بوون).

---

: یەکەمجار نیەتی ئەوەیان هێناوە حەج بکەن، دواتر بڕۆن بۆ یەمەن بۆ لای عبدالرزاق، پاشان کە عبدالرزاق ئەبینن لە مەککە تەواف ئەکات یحیی بن معین ئەڵێت ئەمە فرسەتە با لێرە گوێبیستی فەرموودەکانی ببین و ڕۆیشتن و هاتنی مانگێک، وە پارەی

**ڕێگەمان بۆ ئەگەڕێتەوە، أحمد بن حنبل یش ئەڵێت من شتی وا ناکەم چونکە یەکەمجار نیەتم بۆ ئەوە نەهێناوە، وە الله ش ئاگادارە، هەربۆیە پاش حەج ئەچن بۆیەمەن بۆ لای.**

**٣** - أبو الفَضل ئەڵێت :

(پیاوێک بینی باوکم پێنووسی پێیە، پێی وت : ئەی أبا عبدالله، گەیشتوویتەتە ئەم تەمەنە! وە ئیمامی موسوڵمانانیشت!

باوکم وتی : لەگەڵ پێنووس هەتا ناو گۆڕ).

**٤** - أبو الفَضل ئەڵێت :

(گوێبیستی باوکم بووم وتی : بە دەستی خۆم هەزار فەرموودەم نووسی بێجگە لەوەی کە بۆم نووسراوە).

**٥** - أبو الفَضل ئەڵێت :

(گوێبیستی باوکم بووم وتی : هەر کەسێک هاوەڵانی فەرموودە بە گەورە ڕابگرێت، ئەوە لەبەرچاو رسول الله ﷺ گەورە ئەبێت، وە هەر کەسێک بە کەم تەماشایان بکات، لەبەرچاوی رسول الله ﷺ بچووک ئەبێتەوە، لەبەر ئەوەی هاوەڵانی فەرموودە حیبر و زاناکانی رسول الله ن ﷺ) .

**٦** - أبو الفَضل ئەڵێت :

(ڕۆژێکیان لەلای باوکم بووم ئافرەتەکان بانگیان کردم، وتیان : بە باوکت بڵێ نان یان ئارد مان نەماوە.

پێم وت، وتی : (یەک دەقە).

دواتر شتەکەی دواخست، ئافرەتەکان پێیان وتمەوە، منیش پێم وتەوە، وتی : (یەک دەقە).

کاتێک ئێمە لەم بارودۆخەدا بووین پیاوێک تەقەی دا لە دەرگا، چوومە دەرەوە بۆ لای، بینیم پیاوێکی خۆراسانیە دارێکی بەسەرشانەوەیە کە توورەکەیەکی پێیەوە، پێم وت : چ پێویستیەکەت هەیە؟

وتی : پێویستم بە أحمد بن حنبل ە.

منیش چوومە ژوورەوە و هەواڵم پێدا.

باوکم وتی : (بگەڕێرەوە بۆ لای و پێی بڵێ : بۆچی هاتوویت؟ پرسیارت هەیە؟ یان هاتوویت بۆ بیستنی فەرموودە؟).

پیاوەکە وتی : نە پرسیارم هەیە نە بۆ بیستنی فەرموودە هاتووم.

منیش بە باوکم وت، وتی : (بیکە ژوورەوە).

پیاوەکە هاتە ژوورەوە و دار و توورەکەکەی دانا، پاشان پێی وت : تۆ أحمد بن محمد بن حنبل یت؟

وتی : (بەڵێ).

وتی : من یەکێکم لە خەڵکی خۆراسان، دراوسێیەکم نەخۆش کەوت منیش بەسەرم کردەوە، پێم وت : ئایا هیچ شتێکت پێویستە؟

وتی : (ئەمە پێنج هەزار درهەمە ئەیبەیت و ئەیدەتە دەست أحمد بن حنبل لەدوای مردنم)، جا منیش بەو مەبەستە لە خۆراسانەوە هاتووم.

باوکم پێی وت : (ئایا لە نێوان ئێمە و ئەو پیاوەدا هیچ ناسیاویەک هەیە؟)

وتی : نەخێر.

باوکم پێی وت : (ئایا لە نێوان ئێمە و ئەو پیاوەدا هیچ خزمایەتیەک هەیە؟)

وتی : نەخێر.

باوکم وتی : (ڕەحمەتی الله ـت لێبێت کۆی بکەرەوە).

پارەکەی لێ وەرنەگرت، هەربۆیە پارەکەی هەڵگرت و ئێمە بەجێهێشت.

پاش ماوەیەک باوکم لەناو کتێبەکانیدا دانیشتبوو تەماشای کتێبەکانی کرد و سەری بەرزکردەوە و وتی : (ئەزانی صالح پێش چەنێک خۆراسانیەکە لەلامان بوو؟).

وتم : نەخێر.

وتی : (بە ئەمڕۆوە شەست و یەک ڕۆژە، ئایا هیچ لەو ماوەیەدا برسی بوون؟ یان پێویستان بە شتێک بووە و نەتانبێت؟.

---

**: ئیمام أحمد رحمه الله زۆر دنیانەویست بووە لەکاتێکدا دنیا زۆر بەڕویدا کرایەوە، ئەگەر دەربارەی ژیانی بخوێنیتەوە بۆت دەرئەکەوێت زۆرجار زۆرکەس ویستوویانە پارەی پێ بدەن بەڵام هەرگیز پارەی لە هیچکامێکیان قبووڵ نەکردووە لەکاتێکدا زۆر موحتاج بووە.**

٧ - أبو الفَضل ئەڵێت :

(باوکم داوای لێبووردنی لێ ئەکردم لەبارەی حسن و سعید ەوە، وە ئەیوت : هەرکەسێک کە الله تعالی پەیمانی لێ وەرگرتبێت ئیللا دێتە دنیاوە).

---

**: حسن و سعید دوو کوڕی ئیمامی أحمد ن کە لە کۆتاییەکانی تەمەنیدا لەدایک بوون، هۆکاری داوای لێبووردنی ئیمام أحمد لە صالح ی کوڕی ئەوەیە کە بژێوی و خەرجی منداڵەکان کەوتووەتە سەر صالح چونکە ئیمام أحمد پیر بووە، وە صالح یش منداڵی خۆی زۆربوون، والله أعلم.**

٨ - أبو الفَضل ئەڵێت :

(مجاهد بن موسى هات بۆ لای و وتی : ' ئەی أبا عبدالله، مژدەت لێبێت، ئەم خەڵکە شایەتی باشییت بۆ ئەدەن، خەم مەخۆ ئەگەر ئێستا بگەڕێیتەوە بۆ لای الله عز وجل '، مجاهد ئەگریا و دەستی ماچ ئەکرد، وە پێی وت : ' ئەی أبا عبدالله وەسیەتم بۆ بکە '، باوکیشم ئاماژەی بۆ زمانی کرد) .

٩ - أبو الفَضل ئەڵێت :

(باوکم پێی وتم : ' ئەو کتێبەم بۆ بهێنە کە وتەی إبن إدریس، لە لیث ی تێدایە کە ئەڵێت : طاوس رِقی لە ناڵەناڵ کردن بوو '، منیش بەسەریمدا خوێندەوە، جا هیچ ناڵەی نەکرد تەنها ئەو شەوە نەبێت کە تێیدا وەفاتی کرد) .

١٠ - أبو الفَضل باسی کاتی ناشتنی باوکی ئەکات و ئەڵێت :

(ئێمە کفنمان ئەکرد و نزیکەی سەد کەس لە بەنی هاشم ئامادە بوون، ناوچاوانیان ماچ کرد، دوای ئەوە خستمانە سەر دارە مەیتەکە) .

١١ - أبو الفَضل ئەڵێت :

(پێم گەیشت کە پاش مردنی أحمد بن حنبل لەلای المتوکل باسی ئەوە کرا کە لە نێوان هاوەڵانی أحمد و بیدعەچییەکاندا شەڕ و ئاژاوە ئەبێت، المتوکل بە هەواڵهێنەرەکەی وت : لە هیچ شتێک لە هەواڵی ئەوان ئاگادارم مەکەرەوە، بەڵکو یارمەتیان بدە، چونکە هاوەڵەکەیان پێشەوایەکە لە ئوممەتی محمد

ﷺ، الله تعالى زانی كە تاقیکردنەوە و ئارامگرتنی أحمد چەندە، وە لە ژیان و پاش مردنیشی زانستەکەی بەرز کردەوە، هاوەڵەکانی باشترین هاوەڵن، من پێم وایە الله پاداشتی أحمد ئەداتەوە بە پاداشتی الصدیقین).

## والحمد لله رب العالمين

داواکارین الله عز وجل ڕەحمەت و ڕازیبوونی خۆی بڕژێنیت بەسەر شیخ الإسلام أبو عبدالله أحمد بن محمد بن حنبل الشيباني، وە لەگەڵ رسول الله صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ و هاوەڵانی حەشری بکات و بیخاتە بەرزترین بەشەکانی بەهەشتەوە، وە هیدایەتی ئێمەش بدات بە تێگەیشتنی ئەو و تەواوی زانا پایەرزەکانی تری سەلەف لە قورئان و سوننەت تێبگەین و شوێنپێیان هەڵبگرین،وە لەسەر ئەوە بمانژیەنێت، بمانمرێنێت وە زیندوومان بکاتەوە، آمين أجمعين .

https://t.me/salafyummat

https://t.me/ktebakany_salaf_kurdy

https://t.me/jami3mutun

https://t.me/salaflibrary

https://t.me/atharisalaf

